حکومەتا هەرێما کوردستانێ - عیراق
وەزارەتا پەروەردێ
ڕێڤەبەریا گشتی یا پرۆگرام وچاپەمەنییا

# پەروەردەیا ئیسلامی

## بۆ پۆلا شەشێ بنەڕەت

بەرهەڤکرنا

عبـــدالله عبـــدالرحمن | فاروق محمد علی عباس
ئازاد عمر سـيد أحمد | صـــادق عثمان عـــارف

لێزڤرینا زانستی

د. بشیر خلیل توفیق | أبو بکر علی کاروانی

وەرگێڕان ژ عەرەبی بۆ کرمانجییا ژووری

تەحسین ئیبراهیم دۆسکی | ئیسماعیل تاها شاهین

چاپا دووێ ٢٧١٦ کوردی ٢٠١٦ زایینی ١٤٣٧ مشەختی

## ب ناڤێ خودایێ مەزن و دلۆڤان

# پێشگۆتن

مامۆستاییێن هێژا و قەدرگران، ئەڤ کتێبا بەردەستی تە و قوتابییان، ل سەر زێدەکرنەکا دییا زنجیرا کتێبێن پەروەردەیا ئیسلامی یا نوویە، ل دووڤ وی نەخشەیی هاتییە بەرهەڤکرن، ئەوێ وەزارەتا پەروەردەیێ سەخمەراتی گوهۆڕین و پێشئێخستنا پرۆگرامێ بابەتێ پەروەردەیا ژێگۆتی دانایی، کو بابەتەکی گرنگە بۆ ئاڤاکرن و تیلکرنا کەسینییا مرۆڤێ موسلمان ل دووڤ شێواز و ئاوایێن زانستی و ژ کنارێ پەروەردەییڤە، و ئەڤە هەمی ل بێنا هندێ هاتییە کرن، کو کەسێن باش و مفاگەهین بێنە چێکرن بۆ خزمەتا جڤاکێ، دا پشکدارییەکا ڕژد د ئاڤاکرن و موکومکرنا بنیات و نژیارێ ویدا بکەن، و پاشەڕۆژەکا گەش بۆ مسۆگەر بکەن.

هەروەکی مە د کتێبێن ڕێزێن پێشتردا گۆتی، بابەتێن ڤێ کتێبێ، گوهۆڕینەکا بەرچاڤ د ڕێزکرن و پێشچاڤکرنا واندا هەیە، دەمێ ل بەر یێن بۆری دئێتە بەرانبەرکرن، چ ژ ئالییێ ناڤەڕۆکێڤە بت، چ ژی ژ ئێکا ئارمانج و شێوازێ ڕاهێنانانڤە. و مامۆستایان ژی وەک پێدڤی ماف هەیە، نەمازە د دەمێ ڕاڤەکرنێدا، بابەتان بەرفرەهتر بازۆن و ڤەکۆلن، و مەرج نینە پێگیرییەکا دەق ب دەق، ب وانەیێن دەستنیشانکری و بەرچاڤێن ڤێ کتێبێ بکەن. مامۆستا ژ بەرێ خوەڤە دشێن ب ڕێکا ڕاڤەکرنێ، ڕێکا خوە ب گەلەک ئارمانجێن گرێدایی ب پەروەردەکرنێڤە بێخن.

هیڤییا مە ژ مامۆستاییێن پەروەردەکەرێن قەدرگران ئەوە، دەمێ ڤی پرۆگرامی وەک کریار، دبێژن یان ددەن، مە ژ تێبینی و سەرنجێن خوە یێن ئاڤاکەر و بهادار بێ بار نەکەن، دا ئەم بشێن ڤێ کتێبێ د چاپێن پاشتردا دەولەمەندتر و ب مفاتر لێ بکەین.. چونکو، هەر کار و هەر پرۆژەیەکی هەبت، بەرئاقل نینە، ژ کێماسییان ڤالا بت. خودێ پشت و پشتەڤانێ ڕاستەڕێکرن و ب سەرئێخستنا مە هەمییان بت.

لژنەیا بەرهەڤکەر

(وَقُل رَّبِّ زِدْنِي عِلْمًا)

(طه ١١٤)

## ژ باشناڤێن خودایێ مەزن

**المصور (وێنەکێش):** ئەوە یێ وێنەیێ تایبەتێ هەر چێکرییەکی داییێ و چێکری.

**الغفار (پڕگونەهژێبر):** ئەوە یێ کارێ مرۆڤی یێ کرێت ل دنیایێ ڤەدشێرت، و ل ئاخرەتێ ب وی کاری ل مرۆڤی ناگرت.

**القهار (ڕسواکەر):** ئەوە یێ زۆرداران ڕەزیل و ڕسوا دکەت، و کەس نەشێت فەرمانا وی ڤەگەڕینت.

**العليم (پڕزانا):** ئەوێ زانینا وی هەر تشتەک گرتی و لێ وەرهاتی، و چو تشت ل بەر وی بەرزە نابن.

**القابض (وەرگر):** ئەوە یێ ل دویڤ حەزکرنا خوە، قەنجییا خوە ژ وی بەندەیی دگرت یێ وی بڤێت.



## سۆرەتا (الضحى)

بسم اللّه الرحمن الرحيم

(( وَالضُّحَى ﴿١﴾ وَاللَّيْلِ إِذَا سَجَى﴿٢﴾ مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ
وَمَا قَلَى﴿٣﴾ وَلَلْآخِرَةُ خَيْرٌ لَّكَ مِنَ الْأُولَى﴿٤﴾ وَلَسَوْفَ
يُعْطِيكَ رَبُّكَ فَتَرْضَى﴿٥﴾ أَلَمْ يَجِدْكَ يَتِيمًا فَآوَى﴿٦﴾
وَوَجَدَكَ ضَالًّا فَهَدَى﴿٧﴾ وَوَجَدَكَ عَائِلًا فَأَغْنَى﴿٨﴾ فَأَمَّا
الْيَتِيمَ فَلَا تَقْهَرْ﴿٩﴾ وَأَمَّا السَّائِلَ فَلَا تَنْهَرْ﴿١٠﴾ وَأَمَّا
بِنِعْمَةِ رَبِّكَ فَحَدِّثْ ﴿١١﴾ ))

صدق اللّه العظيم

## شرۆڤە:

(**وَالضُّحَى**) ئەڤە سووندەکە ژ خودێ ب دەمێ تێشتەگەهێ و ڕۆناهییا وێ ، (**وَاللَّيْلِ إِذَا سَجَى**) و ب شەڤێ ئەگەر ئەو ڕاوەستا و تارییا وێ دژوار بوو. (**مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَى**) سووند کو خودایێ تە -هەی موحەممەد- تو نەهێلایی، و تو ژ خوە دوور نەکری پشتی کو وی تو نێزیکی خوە کری، و کەربێن خوە نەهاڤێتینە تە، پشتی کو تو ڤیایی، (**وَلَلْآخِرَةُ خَيْرٌ لَكَ مِنَ الْأُولَى**) وئاخرەت بۆ تە ژ دنیایێ چێترە، (**وَلَسَوْفَ يُعْطِيكَ رَبُّكَ فَتَرْضَى**) چونکی خودایێ تە، پاشی ل ئاخرەتێ هند قەنجییان دێ دەتە تە، کو تو پێ ڕازی ببی. (**أَلَمْ يَجِدْكَ يَتِيمًا فَآوَى**) ئەرێ ما تو بەرێ ئێتیم نەبووی، ڤێجا وی تو حەواندی وچاڤدێری ل تە کر، (**وَوَجَدَكَ ضَالًّا فَهَدَى**) و ما تو یێ وەسا نەبووی تە چو ژ کیتابێ و باوەرییێ نەدزانی، ڤێجا وی بەرێ تە دا ڕێکا ڕاست؟ (**وَوَجَدَكَ عَائِلًا فَأَغْنَى**) و ما تو فەقیر نەبووی، ڤێجا وی تو دەولەمەند کری؟ (**فَأَمَّا الْيَتِيمَ فَلَا تَقْهَرْ**) ڤێجا کانێ چاوا تو یێ ئێتیم بووی، وەسا تو د گەل ئێتیمی یێ دلۆڤان بە، و سەرەدەرییەکا خراب د گەل نەکە، (**وَأَمَّا السَّائِلَ فَلَا تَنْهَرْ**) و تو هەژارێ خواستەک و خوازۆک پاشڤە نەبە، و دلێ وی نەشکێنە، ئەگەر هات و وی داخوازا خوە گەهاندە تە، (**وَأَمَّا بِنِعْمَةِ رَبِّكَ فَحَدِّثْ**) و تو بەحس ژ وێ قەنجییێ بکە یا خودایێ تە د گەل تە کری، و ژ بەر وێ سوپاسییا وی بکە.

## دان و ستاندن:

١- ڕامانا ڤان ئایەتان بنڤیسە:

أ- (**وَأَمَّا السَّائِلَ فَلَا تَنْهَرْ**).

ب- (**وَأَمَّا بِنِعْمَةِ رَبِّكَ فَحَدِّثْ**).

٢- د سۆرەتا (**الضحى**) دا خودایێ مەزن سووند ب چ خوارییە؟

٣- د ئایەتێن (٣-٨) ێدا خودایێ مەزن د گەل کێ دئاخڤت؟

٤- ل بەر سیبەرا ڤێ ئایەتێ: (**فَأَمَّا الْيَتِيمَ فَلَا تَقْهَرْ**)، بەحسێ خێرا قەنجیکرنا د گەل ئێتیمی بکە.

## بزاڤ و چالاکی:

سۆرەتا (**الضحى**) ژ بەر بکە.

# خێرا گوهدانا دەیبابان



دبێژن: ل سەر دەمێ پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) گەنجەک هەبوو دگۆتنێ: (عەلقەمە)، گەلەک پەرستنا خودێ دکر، نڤێژ دکرن و ڕۆژی دگرتن و خێر ددان، دەمەکی نەساخ بوو، و ئێش لێ گران بوو، ئینا ژنکا وی هنارتە پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) دا پێ بزانت، پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) عەممار و سوهەیب و بلال هنارتنە نک، دا ئەو پەیڤا شەهادەتێ پێ بدەنە گۆتن بەری مرنێ، دەمێ ئەو هاتینە نک وان دیت ئەو یێ د سەکەراتێدا، و هندی ئەو هاتنێ دا ئەو شاهدە بدەت، ئەزمانێ وی ب شاهدەیێ نەگەڕیا، و دەمێ وان هنارتییە نک پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) کو ئەو نەشێت شاهدە بدەت، پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) گۆت: ئەرێ ئێک ژ دەیک و بابێن وی یێ زێندییە؟ وان گۆت: بەلێ وی دەیکەکا پیر هەیە، پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) هنارتێ و گۆت: بێژنێ ئەگەر ئەو بشێت بلا بێتە نک مە، و ئەگەر نەشێت ئەم دێ چینە نک.. پیرەژنێ گۆت: جانێ من گۆری وی بت، ئەز دێ ئێمە نک. دەمێ هاتی پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) گۆتێ: دەیکا عەلقەمەیی بێژە من کانێ کوڕێ تە عەلقەمە د گەل تە یێ چاوا بوو؟

وێ گۆت: عەلقەمە مرۆڤەک بوو گەلەک نڤێژ دکرن، و ڕۆژی دگرتن، و خێر ددان.

پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) گۆتێ: و تو د گەل وی یا چاوایی؟

وێ گۆت: ئەز ژێ ڕازی نینم.

گۆتێ: بۆچ؟

گۆت: چونکی وی ژ بەر ژنکا خوە گوهدارییا من نەدکر.

پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) گۆت: ئەگەر دەیکا عەلقەمەیی یا ڕازی نەبت ژ وی، ئەزمانێ وی ب شاهدەیێ ناگەڕت.. پاشی گۆتە بلال: هندەک داران بۆ من کۆم بکە.

پیرێ گۆتێ: هەی پێغەمبەرێ خودێ دار بۆ چنە؟

وی گۆت: دا ئاگری بەردەمە عەلقەمەیی!

پیرێ گۆت: هەی پێغەمبەرێ خودێ، دلێ من ناگرت تو ل بەر چاڤێن من ئاگری بەردەیێ، پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) گۆتێ: دەیکا عەلقەمەیی ئاگرێ خودێ دژوارترە، ڤێجا ئەگەر تە پێ خوەش بت کو خودێ ل وی ببۆرت، ژێ ڕازی بە، چونکی ئەز ب خودێ کەم نڤێژا وی و ڕۆژییێن وی و خێرێن وی چو مفایی ناگەهیننە وی هندی تو ژێ ڕازی نەبی.

هنگی دەیکا عەلقەمەی گۆت: هەی پێغەمبەرێ خودێ، تو و ئەڤ موسلمانێن ئامادە شاهد بن کو ئەزا ژ وی ڕازیمە. پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) گۆتە بلال: هەڕە بەرێ خوە بدێ کانێ ئەو دێ شێت شاهدە بدەت یان نە؟ نە کو گۆتنا دەیکا عەلقەمەیی یا ژ دل نەبت. گاڤا بلال چوویە مالا وی، دیت عەلقەمە یێ شاهدە ددەت، و وێ ڕۆژێ عەلقەمە مر.

پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن) ل وێرێ ئامادە بوو، و د گەل چوو هەتا هاتییە ڤەشارتن، پاشی ل سەر گۆڕا وی ڕابووڤە و گۆت: گەلی موهاجر و ئەنسارییان، هەچییێ گۆتنا ژنکا خوە ب سەر یا دەیکا خوە بێخت، لەعنەتێن خودێ و ملیاکەتان و هەمی مرۆڤان ل وی بن، خودێ کارەکی ژ وی قەبوول ناکەت هەتا ئەو تۆبە نەکەت، و وێ ڕازی نەکەت.

## ڕاهێنان

**(١)**

بلا سەیدا داخوازێ ژ قوتابییان بکەت کو هندەک ژ وان ئایەتێن سۆرەتا (الإسراء) بخوونن یێن پەیوەندی ب قەنجییا د گەل دەیبابانڤە هەی.

**(٢)**

بلا سەیدا داخوازێ ژ هندەک قوتابییان بکەت، چیرۆکەکێ یان سەرهاتییەکێ بێژن بەحسێ ڕێزگرتنا دەیبابان بکەت.

**(٣)**

د ستوونێن خوارێدا، ڕستەیا دورست بگەهینە یا بەرانبەری وێ:

| | |
|---|---|
| ڕێزگرتنا دەیبابان | باخڤت. |
| چەنگێ خوە بۆ وان | کارەکێ فەرە. |
| ئەگەر تو درەنگ زڤڕییە مال | بشکێنە. |
| دڤێت مرۆڤ جوان د گەل وان | داخوازا لێبۆرینێ ژ وان بکە. |

## بزاڤ و چالاکی:

١- ڤان ئایەتێن سۆرەتا (الإسراء) ژ بەر بکە: (( **وَقَضَى رَبُّكَ أَلاَّ تَعْبُدُواْ إِلاَّ إِيَّاهُ وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِندَكَ الْكِبَرَ أَحَدُهُمَا أَوْ كِلاَهُمَا فَلاَ تَقُل لَّهُمَآ أُفٍّ وَلاَ تَنْهَرْهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوْلاً كَرِيمًا﴿٢٣﴾ وَاخْفِضْ لَهُمَا جَنَاحَ الذُّلِّ مِنَ الرَّحْمَةِ وَقُل رَّبِّ ارْحَمْهُمَا كَمَا رَبَّيَانِي صَغِيرًا﴿٢٤﴾** )) **(الاسراء ٢٣-٢٤)**.

٢- ڤێ فەرمۆدەیێ ژ بەر بکە: ((**رِضَا اللهِ فِي رِضَا الْوَالِدَيْنِ، وَسَخَطُ اللهِ فِي سَخَطِ الْوَالِدَيْنِ**)).

## ژ تۆرەیێ سەرەدانێ

# خواستنا دەستووری



سەرەدان ئێک ژ وان سالۆخەتانە یێن پێدڤییە ل نک مرۆڤێ موسلمان هەبت، ژ بەر کو ئەو ڤیانێ د ناڤبەرا ئەندامێن جڤاتێدا پەیدا دکەت، بەلێ سەرەدانێ هندەک تۆرە هەنە دڤێت مرۆڤ کاری پێ بکەت، ژ وان: دڤێت مرۆڤ دەستووری ژ خەلکێ مالێ بخوازت، دا ئەو خوە بەرهەڤ بکەن بۆ پێشوازیکرنا مێڤانان.

هەر مالەکا هەبت ماف هەیە کو کەسەک بێ ئاگەهداری و خواستنا دەستووری نەچتێ، لەو دڤێت بەری سەرەدانێ، مرۆڤ سێ جاران دەستووری ژ خودانێن مالێ بخوازت، و ئەگەر دەستوور بۆ نەهاتەدان، یان کەس د مالێ دا نەبوو، دڤێت ئەو نەچتە ژۆر، و ئەگەر کەسەک د مال دا هەبوو و دەستوور دا مێڤانی کو بچتە ژۆر هنگی دورستە بچتە ژۆر.

و دەمێ ڕوودانەکا نەئاسایی پەیدا دبت، وەکی: هلبوونا ئاگری، یان هاتنا دزەکی، بۆ مرۆڤی هەیە ئەو د هەوارا خەلکێ مالێ بچت، و هاریکارییا وان بکەت بێ وەرگرتنا دەستووری.

## دان و ستاندن:

١- ب هاریكارییا سەیدایی، دان و ستاندنێ د گەل هەڤالێن خوە بكە ل دۆر (خواستنا دەستووریێ) بەری سەرەدانێ، د گەل ب كارئینانا دیمەنەكێ زارڤەكری د پۆلێڤە، ل دۆر ڤێ چەندێ.

٢- ل دۆر ڕامانا ڤێ ئایەتێ باخڤە: ((**يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَدْخُلُوا بُيُوتًا غَيْرَ بُيُوتِكُمْ حَتَّى تَسْتَأْنِسُوا وَتُسَلِّمُوا عَلَى أَهْلِهَا**)).

٣- ب هاریكارییا سەیدایی ڤێ فەرمۆدەیێ شرۆڤە بكە: ((**اذا استأذن أحدكم ثلاثاً فلم يؤذن لَهُ فليرجع**)). (بوخاری و موسلم ڤەگوهازتییە).

٤- ئەگەر مرۆڤی سەرەدانا مالەكێ كر و دەستوور بۆ هاتەدان، دورستە ئەو بچتە ژۆر یان نە؟

## بزاڤ و چالاكی:

ڤان ئایەتان ژ بەر بكە: (( **يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَدْخُلُوا بُيُوتًا غَيْرَ بُيُوتِكُمْ حَتَّى تَسْتَأْنِسُوا وَتُسَلِّمُوا عَلَى أَهْلِهَا ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴿٢٧﴾ فَإِن لَّمْ تَجِدُوا فِيهَا أَحَدًا فَلَا تَدْخُلُوهَا حَتَّى يُؤْذَنَ لَكُمْ وَإِن قِيلَ لَكُمُ ارْجِعُوا فَارْجِعُوا هُوَ أَزْكَى لَكُمْ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ** )) (**النور٢٧ - ٢٨**).



## خوە دوورکرن ژ کەیف ب خوەهاتن و خوەمەزنکرنێ



ژ سالۆخەتێن باشێن موسلمانی ئەوە، ئەو خوە دوور بێخت ژ خوە مەزنکرنێ و گەلەک کەیف ب خوە نەئێت، چونکی خوە مەزنکرن، و کەیف ب خوە هاتنا زێدە ژ گونەهێیە وەکی د فەرمۆدەیەکێدا هاتی، و مرۆڤ هەمی وەکی ئێکن و ئەو هەمی ژ ئادەمینە، و ئادەم ژ ئاخێیە، لەو چێ نابت بۆ کەسێ خوە ژ خەلکی بلندتر ببینت ، یان خوە دفنبلند بکەت ل سەر وان. و ئەو کەسێ ڕوویێ خوە ژ خەلکی وەرگێڕت، و ب مەزناتی ب ڕێڤە بچت، ئەو باوەرییێ ب قەنجیا خودێ نائینت، و خودێ حەز ژ وی ناکەت.

و نابت ژینا دنیایێ مە بخاپینت، وەکی وی جۆتیاری یێ کەیف ب گیایی دئێت دەمێ باران لێ دئێت و کەسک دبت، پاشی پشتی دەمەکی زەر دبت و دبەهت و دبتە پووش. دڤێت مرۆڤ عەقلی بۆ خوە ژ ڤێ چەندێ بگرت.

ئەو کەسێ خوە مەزن دکەت و کەیف ب خوە دئێت، ب ژینا دنیایێ دئێتە خاپاندن، و ب خوەشییێن وێڤە مژوول دبت، و ڕۆژا دووماهییێ ژ بیر دکەت، و هیڤییا زێدە ب لێبۆرینێ ژ گونەهان بلا بەرێ مە نەدەتە هندێ ئەم ڕژد ببن ل سەر گونەهێ.

## دان و ستاندن:

١– بۆچ دڤێت مرۆڤ خوه مەزن نەکەت، و خوه مەزنکرن بەرێ مرۆڤی ددەتە چ تشتی؟

٢– ئایەتەکا قورئانێ ل دۆر ژینا دنیایێ بێژە، پاشی ب هاریکارییا سەیدایی شرۆڤە بکە.

٣– ئەگەرێن کەیف ب خوەهاتن و خوە گەلەک دیتنێ چنە؟



# یەكسانی و ڕێزگرتن ل مافێ مرۆڤی



سەیدا: قوتابییێن خوەشڤی، دینێ ئیسلامێ بهایەكێ زێدە داییە مرۆڤی، و د گەل جوداییا دین و نفش و ڕەنگێ وی ئیسلامێ داخواز كرییە ڕێز لێ بێتە گرتن. خودایێ مەزن دبێژت: ((يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ)) ژ ڤێ ئایەتێ ئاشكەرا دبت كو چو جودایی د ناڤبەرا نێر و مێ و ڕەش و سپی و دەولەمەند و هەژاریدا نینە.. لەو چێ نابت ئەم جوداییێ بێخینە ناڤبەرا چو مرۆڤان، ما نە؟

قوتابی: بەلێ سەیدا..

سەیدا: ئیسلامێ مافێ داییە وان كەسێن نەموسلمان كو ئەو ل دووڤ بیر و باوەرێن خوە پەرستنا خودێ بكەن، لەو پێدڤییە ل سەر مە ئەم ڕێزێ ل وان ژی بگرین.

شڤان: بەلێ سەیدا، هەڤالێ مە ڕەشۆ ئێزدییە، ئەم ڕێزێ لێ دگرین.

یەشار: ل تاخێ مە هندەک مالێن نەموسلمان هەنە، ئەز ل هلكەڤتنان سەرا وان ددەم.

سەیدا: سەحەت خوەش، ل هەمی دەمان دڤێت ئەم ڕێزێ ل وان بگرین. ما هەوە گوهـ ل ڤێ ئایەتا پیرۆز نەبوویییە ئەوا دبێژت: ((**ولقد كرمنا بني آدم وفضلناهم على كثير ممن خلقنا تفضيلاً**)) (الاسراء: ٧٠) گەلی قوتابیییێن خوەشڤی، هەر ژ بەرێ وەرە گەلەک دین و بیر و باوەرێن جودا ل کوردستانێ هەنە.

ئەرێ هوون دزانن ئەو ئایینێن جودا کیژکن؟

یەشار: بەلێ سەیدا، جوهی..

شرین: و فەلە و ئێزدی..

سەیدا: سەحەت خوەش، و هندەک بیر و باوەرێن دی ژی هەنە..



## ڕاهێنان

١- ب خیچەکێ هەر پەرستگەهەکێ بگەهینە دینێ وێ:

| | |
| --- | --- |
| ئیسلام | کنیشت |
| فەلاتی | مزگەفت |
| جوهی | دێر |
| ئێزدی | لالش |

٢- ڤان ڤالاهییان ب هندەک پەیڤێن گونجایی تەژی بکە:

(یەکسانییێ - جودایی - ڕێزگرتنێ)

* پێدڤییە ............ ل هەمی مرۆڤان بگرین.

* ئیسلام داخوازا ........... د ناڤبەرا خەلکیدا دکەت.

* نابت ......... د ناڤبەرا خەلکیدا هەبت، ژ بەر ڕەنگ و نفشێ وان.

## مفایەک:

ئیسلام دینێ براتی و ئاشتی و ڤیانێیە.

## بزاڤ و چالاکی:

١- ڤێ ئایەتا پیرۆز ژ بەر بکە: ((**يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ**)) (**الحجرات**: ١٣).

٢- ڤێ فەرمۆدەیا پیرۆز ژ بەر بکە: ((**الناس سواسية كأسنان المشط**)).

## وانەیا حەفتێ

# قەنجی



سەیدایێ پەروەردەیا ئیسلامی، داخواز ژ قوتابییێن رێزا شەشێ کر، د گەل وی دەرکەڤن، دا ئەو ب رەنگەکێ بەرچاڤ کرنا کارێ باش نیشا وان بدەت، و هەر ل بەر دەرێ قوتابخانەیێ و ل ناڤ باغچەیێ وێ وان دەست پێ کر، هەر وەسا ل وی تاخی یێ قوتابخانە دکەڤتێ، دەمێ وان دەست ب پاقژکرنێ کری، و گلێش راکری، و داروبارێن باخچەیی ئاڤدایین. و پشتی وان کارێ خوە ب دووماهی ئینایی، سەیدایی قوتابی هەمی ل باغچەیێ قوتابخانەیێ کۆمکرن و پسیار ژ وان کر: ئەم فێری چ بووین؟ و مە چ کار کر؟ و پشتی ڤێ وەستیانێ هوون هەست ب چ دکەن؟ و کی دێ فەرمۆدەیەکا پیرۆز ل سەر ڤی کارێ مە بێژت؟

و وی دەلیڤە دا قوتابییان، کو ئەو خوە بکەنە کۆم کۆم، دا بەرسڤێ ل سەر ڤان پسیاران بدەن، پشتی بێنەکێ سامانی د پێش کۆما خوەڤە (ئەوا ژ چار قوتابییان پێکهاتی) گۆت:

– تشتێ ئەم فێر بووین ئەوە دڤێت مرۆڤ وەستیانێ ببینت دا هاریکارییا خەلکی بکەت، و ژینگەها خوە پاقژ بکەت.

رۆناکێ د پێش کۆما خوەڤە (کۆما هاریکاری) بەرسڤا پسیارا ئێکێ دا، و گۆت:

- ب ڕێكا هاریكارییا ئێكدو، مە شیا د دەمەكێ كێمدا، ڤی كاری بكەین.

ئێكێ دی گۆت:

- مە قەت هەست ب وەستیانێ نەكر، چونكی مە هەمییان پێكڤە كار دكر.

ب ڤی ڕەنگی و پشتی هەست ب كەیفخوەشییێ كرین، وان سوپاسییا سەیدایی كر ل سەر فێركرنا وان ب ڤی ڕەنگی، و وان داخواز ژێ كر، كو ئەو فەرمۆدەیەكێ ل سەر ڤی كاری بێژت، سەیدایی پشتی سوپاسییا وان كری گۆت:

- گەلی زارۆكان، دینێ مە داخوازێ ژ مە دكەت ئەم پێكڤە هاریكارییا خەلكی بكەین، و وی كاری بكەین یێ خەلك مفایی ژێ ببینت، و پێغەمبەرێ مە (سلاڤ لێ بن) دبێژت: ((خير الناس مَن نفع الناس)).

وگۆت: هەڤالێن پێغەمبەری ژی (سلاڤ لێ بن) باشترین نموونە بوون ل سەر هاریكارییێ، وەكی ئەنسارییان دەمێ خەلكێ مەكەهێ ب مشەختی هاتینە باژێڕێ مەدینەیێ، وان دەستێ هاریكارییێ بۆ وان درێژ كر، و ئەو كرنە هەڤپشكێن خوە د مالێ خوەدا، و پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن) دبێژت: ((إنكم لَن تَسعُوا الناسَ بأموالكم ولكنْ سَعُوهم بأخلاقكم)).



## دان و ستاندن

١- سەیدایی چ داخواز ژ قوتابییان کر؟

٢- بۆچ قوتابییان هەست ب خوەشییێ کر پشتی وان کارێ خوە ب دووماهی ئینایی؟

٣- ب چ ڕەنگی خەلکێ مەدینەیێ پێشوازی ل مشەختان کر؟

## بزاڤ و چالاکی

ڤێ فەرمۆدەیێ ژ بەر بکە: ((إنكم لَن تَسعُوا الناسَ بأموالكم ولكنْ سَعُوهم بأخلاقكم)).



# چاندن




دەمێ ئازاد ژ قوتابخانەیێ زڤڕییە مال، بابێ خوە د ناڤ باغچەیێ مالێدا دیت، جار باغچە ئاڤدا، و جار ژ بەلگێن وەریایی پاقژ دکر، ئازاد پسیار ژ بابێ خوە کر کانێ بۆچ ئەو هندە گرنگییێ ددەتە باغچەیێ مالێ، بابێ وی گۆتێ:

– کوڕێ من، پەیوەندییا مرۆڤی د گەل ئەردی بۆ زەمانەکێ کەڤن دزڤڕت، دەمێ مرۆڤی دیتی گەلەک ژ وان خێرێن دگەهنە وی ژ ئەردی دگەهنێ، و شارستانییێن کەڤن وەکی شارستانییا (دۆلا هەردو ڕۆباران) ل نێزیکی ڕۆبارێ دجلە ل عیراقێ، و (دۆلا نیلی) ل مسرێ ئەڤ چەندە بنەجهـ کر. و دینێ ئیسلامێ ژی بەرێ مە ددەتە چاندنێ، و پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) کارێ چاندنێ ل بەر مە شرین کرییە.

ئازادی گۆتە بابێ خوە: ئەرێ باب ما دڤێت ئەم هەمی ب کارێ چاندنێ ڕاببین؟

بابێ وی گۆتێ: کوڕێ من، ئەگەر هندەک کەس ب کارێ چاندنێ ڕابوون بەرهەمێ وان دێ تێرا خەلکێ دی ژی کەت، و چاندنا داران ل باژێران مفایی دگەهینت و بایی پاقژ دکەت، و دیمەنێ باژێری جوان دکەت. و ئەڤە ئەرکێ مە هەمییانە.

## دان و ستاندن

١- ب هاریکارییا سەیدایی ڕامانا (چاندنێ) د زمانی دا بزانه .

٢- فەرمۆدەیەکێ ل دۆر بهایێ چاندنێ بێژە .

٣- چاوا ئەم دێ داروبارێ باغچەیان پارێزین؟

## بزاڤ و چالاکی

ڤێ فەرمۆدەیێ ژ بەر بکە: (( **ما مِنْ مُسلِمٍ يغرسُ غرساً أو يَزرَعُ زَرعاً، فيَأْكُلُ منهُ طَيْرٌ أَو انسانٌ أو بَهيْمَةٌ، الاّ كانَ لَهُ بِهِ صَدَقَةً** )).



## سۆرەتا (الشرح)

بسم اللّٰه الرحمن الرحيم

(( أَلَمْ نَشْرَحْ لَكَ صَدْرَكَ ﴿١﴾ وَوَضَعْنَا عَنكَ وِزْرَكَ ﴿٢﴾
الَّذِي أَنقَضَ ظَهْرَكَ ﴿٣﴾ وَرَفَعْنَا لَكَ ذِكْرَكَ ﴿٤﴾ فَإِنَّ مَعَ
الْعُسْرِ يُسْرًا﴿٥﴾ إِنَّ مَعَ الْعُسْرِ يُسْرًا﴿٦﴾ فَإِذَا فَرَغْتَ
فَانصَبْ﴿٧﴾ وَإِلَى رَبِّكَ فَارْغَبْ﴿٨﴾ ))

صدق اللّٰه العظيم

## شرۆڤەكرن:

(أَلَمْ نَشْرَحْ لَكَ صَدْرَكَ) ئەرێ ما مە ب ڕۆناهییا ئیسلامێ سنگێ تە -هەی موحەممەد- بۆ تە فرەهـ نەكرییە پشتی كو ئەو تەنگ بووی و تژی نەخوەشی بووی؟ (وَوَضَعْنَا عَنكَ وِزْرَكَ. الَّذِي أَنقَضَ ظَهْرَكَ) و ما مە ب وێ چەندێ بارێ تە یێ گران ژ سەر پشتا تە نەدانا، ئەو بارێ نێزیک بوو پشتێ ل تە بشكێنت؟ ڤێجا تو تەنا و روحەت بووی. (وَرَفَعْنَا لَكَ ذِكْرَكَ) و ب وان قەنجییێن مە د گەل تە كرین، ما مە تو ل جهەكێ بلند نەدانایی؟ ڤێجا ناڤ و دەنگێن تە د ناڤ خەلكیدا بلند بوون. (فَإِنَّ مَعَ الْعُسْرِ يُسْرًا . إِنَّ مَعَ الْعُسْرِ يُسْرًا) ڤێجا نەخوەشییا دژمنێن تە دگەهیننە تە، بلا تە ژ بەلاڤكرنا پەیامێ سست نەكەن؛ چونكی هەر تەنگاڤییەكێ بەرفرەهییەک د گەلە، و هەر تەنگاڤییەكێ بەرفرەهییەک د گەلە. (فَإِذَا فَرَغْتَ فَانصَبْ) ڤێجا ئەگەر كارێ تە یێ دنیایێ ب دووماهی هات، تو خوە ب پەرستنێڤە بوەستینە، (وَإِلَى رَبِّكَ فَارْغَبْ) و تو وی تشتی بخوازە یێ ل نک خودایێ تە هەی، خواستنێ ژ وی ب تنێ بكە.

## دان و ستاندن:

١- د ڤێ ئایەتێدا: (أَلَمْ نَشْرَحْ لَكَ صَدْرَكَ) گۆتن بۆ كێیە؟

٢- ڕامانا ڤێ ئایەتێ چییە: (إِنَّ مَعَ الْعُسْرِ يُسْرًا)؟

## بزاڤ و چالاكی:

سۆرەتا (الشرح) ژ بەر بكە.

# ژ سالۆخەتێن سەحابییان



ئێک ژ سالۆخەتێن باش یێن سەحابییێن پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) ئەو بوو وان بۆ دەستڤەئینانا مفایەکی یان پاشڤەبرنا زیانەکێ، خەلکێ دی ب پێش خوە دئێخست، و وەکی بەحسکرنا ژ هەر سالۆخەتەکێ باش، سەیدایی هۆسا دەست ب بابەتی کر بەری ئەو کاران ل سەر وان قوتابییان لێکڤە بکەت، یێن ل دۆر وی کۆمبوویین پشتی ئەو د گەشتەکا بهاریدا، یا ئێک ژ قوتابخانەیێن هەولێرێ، گەهشتینە هاڤینگەها بێخال.

شڤان داخواز ژ سەیدایی کر سەرهاتییەکێ ژ ژیانا پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) و سەحابییان بۆ وان ڤەگێرت، سەیدایی سوپاسییا وی کر و گۆت: دەمێ موسلمان ژ مەکەهێ مشەخت بوویین و چوویینە بازێرێ مەدینەیێ، پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) هەر موسلمانەکێ مشەختبوویی ژ مەکەهێ کرە برایێ موسلمانەکێ خەلکێ مەدینەیێ، و بارا (سەعدێ کورێ رەبیعێ ئەنصاری) ئەو بوو (عەبدرەحمانێ کورێ عەوف) برایێ وی بت. سەعد گۆتە عەبدررەحمان: ئەز ئێک ژ دەولەمەندێن مەدینەییمە، و من دو بیستان هەنە، ئێکی بۆ خوە ژێ بگرە، عەبدررەحمان سوپاسییا وی کر و گۆتێ: خودێ بەرەکەتێ بێختە مالێ تە و عەیالێ تە، ئەز مرۆڤەکێ بازرگانم، ئەز حەز دکەم تو

ڕێکا بازارێ نیشا من بدەی.. و پشتی هنگی خودێ ڕێ ل بەر وی ڤەکر، و وی مالەکێ زێدە ب دەست خوەڤە ئینا، و بێ منەت بوو.

کوڕێن من، ڤێجا دڤێت ئەم ژی د گەل ئێکدو ب ڤی ڕەنگی بین، و وەکی ڤان سەحابییان بین ئەوێن خودێ مەدحێن وان کرین و گۆتی: (( **ويؤثرونَ على أنفسهم ولو كان بهم خصاصة** )).

پشتی هنگی سارایێ سەرهاتییەکا ئیمام عەلی بۆ هەڤالێن خوە ڤەگێڕا وەکی وێ ژ بابێ خوە گوهـ لێ بووی، و گۆت:

ئەڤ ئایەتا پیرۆز ژ سۆرەتا (الدهر): (( **ويطعمون الطعام على حُبّه مسكيناً ويتيماً وأسيراً، إنّما نُطعِمكم لِوجهِ الله لانُريدُ منكم جزاءاً ولاشكوراً** )) د دەرهەقا ئیمام عەلیدا هاتبوو خوارێ، دەمێ ئەو د گەل خەلکێ مالا خوە سێ شەڤان برسی نڤستی، ژ بەر کو ئێڤارییا هەر سێ ڕۆژان هەژارەک و ئێتیمەک و ئێخسیرەک دهاتە بەر دەرێ وان و داخوازا خوارنێ ژ وان دکر، هەر چەندە وان هەوجەیی ب خوارنێ هەبوو ژی، بەلێ وان خوارنا خوە ددا وان، و خوە دهێلانە برسی، ڤێجا ئەڤ ئایەتە هات و مەدحێن وان کر.

پشتی هنگی هەمی قوتابییان زانی کانێ پێدڤییە مرۆڤ د گەل برایێ خوە یێ چاوا بت، لەو هەر ئێکی دەست ب کاری کر و خوە وەستاند دا هەڤالێ وی بێهنا خوە بدەت، و ب ڤی چەندێ وان ڕۆژەکا خوەش برە سەری، و ئێڤاری ب کەیف و خوەشیڤە زڤڕینە هەولێرێ پشتی ب هاریکارییا سەیدایی شیایین وان ئایەتان د تورمبێلێدا ژ بەر بکەن.

## ڕاهێنان:

سەیدا قوتابییان ل سەر گرۆپان لێکڤە دکەت، دا ئەو هاریکارییا قوتابییێن ژ خوە بچووکتر بکەن، وەکی قوتابییێن ڕێزا ئێکێ و دویێ دەمێ ئەو ژ قوتابخانەیێ دەردکەڤن و ژ جادەیێ دەرباز دبن، دا ب ڤێ چەندێ گیانێ براتی و هاریکارییێ ل نک وان پەیدا بکەت.

## دان و ستاندن:

١- قوتابییێن ڕێزا شەشێ د گەشتا خوەدا کیڤە چوون؟

٢- کیژ قوتابی داخواز ژ سەیدایی کر کو سەرهاتییەکێ ژ ژیانا پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) و سەحابییان ڤەگێڕت؟

٣- کێ سەرهاتییا ئیمام عەلی ڤەگێڕا؟

٤- ئیمام عەلی و خەلکێ مالا وی، چەند ڕۆژان مانە برسی؟

## بزاڤ و چالاکی:

سەیدا دێ داخوازێ ژ قوتابییان کەت کو ل مال سەرهاتییەکێ ل دۆر هاریکارییێ بنڤیسن، ژ وان سەرهاتییێن وان بهیستین، دا ل وانەیا بێت بخوونن.



وانەیا یازدەیێ

## دیمەنەک ژ ژیانا تابعییان

# زانا و زۆردار



دبێژن: (حەجاجێ کورێ یووسفێ سەقەفی) قەسرەک بۆ خوە ل باژێرێ واستێ (ئەوێ نوکە دبێژنێ: کووت) ئاڤاکر، و دەمێ ئاڤاهی ب دوماهی هاتی، وی داخواز ژ خەلکی کر، بێن بەرێ خوە بدەنێ و دوعایا بەرەکەتێ بۆ بکەن.

ئێک ژ تابعییێن مەزن و زانایێ ناڤدار یێن کو هەڤالینییا سەحابییان کری، ئەوێ دبێژنێ: حەسەنێ بەصری، حەزکر ڤێ دەلیڤەیێ ژ دەست خوە نەکەت، دەمێ خەلک هەمی کۆم دبن، دا هندەک شیرەتان ل وان بکەت، ئەو ژی د گەل خەلکی دەرکەڤت، و دەمێ ئەو گەهشتینە قەسرێ، و هندی ئاڤاهییەکێ جوان بوو، هەمی مەندەهۆش بوون، ئیمام حەسەنێ بەصری گۆت: ((مە ئەو قەسر دیت یا ڤی مرۆڤێ پیس ئاڤاکری، و ئەم دزانین ئەو قەسرا فیرعەونی ئاڤاکری ژ یا ڤی مەزنتر و بلندتر بوو، بەلێ خودێ فیرعەون و ئاڤاهییێ وی تێبرن، خوەزی حەجاج زانیبا کو خەلکێ ئەسمانی ئەو نەڤێت، و خەلکێ ئەردی ژی ئەو یێ خاپاندی..)).

ئێک ژ مرۆڤێن ئامادە ترسییا حەجاج ئیمامی بکوژت، لەو گۆتێ: هندە بەسە!

حەسەنێ بەصری گۆتێ:

- خودێ پەیمان ژ زانایان وەرگرتییە کو ئەو ڕاستییێ بێژن و ژ خەلکی ڤەنەشێرن.

کەربێن حەجاج ڤەبوون و ڕۆژا دی هنارتە ئیمامی، دا وی ئیزا بدەت، و گاڤا ئیمام چوویە کۆچکا وی، حەجاج پێشڤە ڕابوو، و گۆتێ: کەرەم بکە بابێ سەعید، و ئەو دانا ب ڕەخ خوەڤە، خەلک ژ ڤێ چەندێ حێبەتی بوون، و گاڤا حەسەن ڕوونشتی حەجاج هندەک پسیارێن دینی ژێ کرن، و ئیمامی بەرسڤا وی دا.. و حەجاج گۆتێ: تو سەروەرێ زانایانی.

و گاڤا ئیمام دەرکەڤتی هندەکان گۆتێ: ئەڤە چ بوو چێبووی؟

وی گۆت: دەمێ ئەز ب ژۆر کەڤتیم، من دوعایەک کر و گۆت: هەی خودایێ قەنجی د گەل من کری، و ئەز ژ تەنگاڤییێ ڕزگار کریم، تو کەربا وی ل سەر من سار بکە و بکە تەناهی، هەر وەکی تە ئاگر ل سەر ئیبراهیم پێغەمبەر سار کری وکرییە تەناهی.

## ئەنجام:

ژ ڤێ سەرهاتییێ ئاشکەرا دبت کو پێدڤییە زانا بەرێ خەلکی بدەنە باشییێ، و بەرانبەر زۆرداران ڕاوەستن.

## پسیار:

١- حەسەنێ بەصری چ شیرەت ل خەلکی کر؟

٢- بۆچ ئیمام نەترسا دەمێ چوویییە نک حەجاج؟

٣- ئەرکێ زانایان چییە؟ و کارێ وان د جڤاکێ دا چییە؟

## دوعایەک:

اللهم اجعل نقمة الظالمين علينا برداً وسلاماً كما جعلت النار برداً وسلاماً على ابراهيم.

## بزاڤ و چالاکی:

ڕاپۆرتەکا کورت ل دۆر ژیانا زانایێ مەزن (حەسەنێ بەصری) بنڤیسە.

# کورێ خەلیفەیی



خەلیفەیێ ناڤدار عومەرێ کورێ عەبدلعەزیز هەژمارەکا کورِ و کچان هەبوو، هەمی ژ مرۆڤێن چاک بوون، بەلێ کورێ وی یێ ناڤێ عەبدلمەلک ژ وان هەمییان چاکتر بوو.

دەمێ بابێ وی بوویە خەلیفە، خوتبەیەک بۆ خەلکی خواند و تێدا داخواز ژ وان کر، ئەو ل وی ببۆرن، چونکی وی نەڤێت ببتە خەلیفە، بەلێ خەلکی ڕژدی ل سەر هندێ کر، کو ئەو ببتە خەلیفە، هنگی وی گۆتە وان:

– گەلی مرۆڤان، هەچییێ گوهدارییا خودێ بکەت، دڤێت گوهدارییا وی بێتەکرن، و هەچییێ گوهدارییا خودێ نەکەت، مافێ وی نینە، داخوازێ ژ کەسێ بکەت کو گوهدارییا وی بکەت. گەلی مرۆڤان، گوهدارییا من بکەن، هندی ئەز گوهدارییا خودێ بکەم، و هەر جارەکا من گوهدارییا خودێ نەکر، هوون ژی گوهدارییا من نەکەن.

پاشی ژ مینبەرێ هاتە خوارێ و چوو مالا خوە، دا دەمەکی بێنا خوە ڤەکەت، بەلێ هێشتا

پال نەدایی، کوڕێ وی عەبدلمەلک (ئەوێ هنگی هەڤدەسالی) هاتە نک و گۆتێ:

- میرێ باوەرداران، تو دێ چ کەی؟

گۆت:

- کوڕێ من، من دڤێت پیچەکێ بێنا خوە ڤەکەم، ئەز وەستیاییمە.

کوڕێ وی گۆتێ:

- تە دڤێت بێنا خوە ڤەکەی بەری زۆرداریێ ژ سەر وان کەسان ڕاکەی، ئەوێن زۆرداری لێ هاتییەکرن؟

خەلیفەیی گۆت: کوڕێ من، شڤێدی هەمییێ ئەز نەنڤستبووم، پیچەکێ دێ نڤم و نیڤرۆ دێ چم وێ کەم یا تو دبێژی، ئەگەر خودێ حەز بکەت.

کوڕێ وی گۆتێ: و کی دبێژت هەتا نیڤرۆ تو دێ مینییە ساخ؟

ڤێ گۆتنێ خەو ژ چاڤێن عومەر ڕەڤاند، و هێز دا لەشێ وی یێ وەستیایی، و وی گۆتە کوڕێ خوە: کانێ ب نک منڤە وەرە.. پاشی وی ئەو دا بەر سنگێ خوە و ماچی کر و گۆت:

- سوپاس بۆ وی خودایی بن ئەوێ کوڕێ من بۆ من کرییە هاریکار..

پاشی دەرکەڤت و فەرمان دا د ناڤ خەلکیدا بانگ بێتە هلدێران: هەچییێ زۆرداریەک لێ هاتبتەکرن بلا گازندەیا خوە بینتە نک خەلیفەیی.

## ئەنجام:

ژ ڤێ سەرهاتییێ دئێتە زانین، کو پێدڤییە مرۆڤ هەمی کەسان شیرەت بکەت، ئەگەر خوە ئەو کەسێ مرۆڤ شیرەت دکەت، ژ مرۆڤی مەزنتر ژی بت، و پێدڤییە گەنجێن مە چاڤ ل عەبدلمەلک بکەن، و مفایی بۆ خوە ژ سەربۆرا وی وەربگرن.

## پسیار:

١- بۆچ دبێژنە خەلیفە عومەرێ کورێ عەبدلعەزیز (راشدی)یێ پێنجێ؟

٢- بۆچ عەبدلمەلک نەهێلا بابێ وی بۆ خوە بنڤت و بێنا خوە ڤەکەت؟

٣- ئەرکێ وان کەسان چییە ئەوێن بابێن وان بەرپرساتییا گشتی دکەڤتە د دەستاندا؟

## بزاڤ و چالاکی:

کورتییەکێ ژ ژیانا خەلیفە (عومەرێ کورێ عەبدلعەزیز) بنڤیسە، و بەحسێ دادپەروەرییا وی بکە.



## سۆرەتا (الكافرون)

### تەنێ بۆ شرۆڤەکرنێیە

بسم اللّه الرحمن الرحيم

(( قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ﴿١﴾لَا أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ﴿٢﴾ وَلَا أَنتُمْ عَابِدُونَ مَا أَعْبُدُ﴿٣﴾ وَلَا أَنَا عَابِدٌ مَّا عَبَدتُّمْ﴿٤﴾ وَلَا أَنتُمْ عَابِدُونَ مَا أَعْبُدُ﴿٥﴾ لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ﴿٦﴾ ))

صدق اللّه العظيم

## ئەگەرا هاتنەخوارا سۆرەتێ:

کۆمەکا قورەیشییان هاتنە نک پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) و گۆتنێ: سالەکێ تو خوداوەندێن مە بپەرێسە، و سالەکێ ئەم دێ خودایێ تە پەرێسین، ئەگەر دینێ تە ژ یێ مە باشتر بت بارا مە دێ تێ کەڤت، و ئەگەر دینێ مە ژ یێ تە باشتر بت، بارا تە دێ تێ کەڤت.. هنگی ئەڤ سۆرەتە هاتە خوارێ، و خودێ گۆتێ: هەی موحەممەد، تو بێژە وان گاوران: ئەز وان سەنەم و خوداوەندان ناپەرێسم ئەوێن هوون دپەرێسن. و هوون ژی وی خودایی ناپەرێسن یێ ئەز دپەرێسم، و د پاشەڕۆژی ژیدا ئەز وان سەنەم و خوداوەندێن ژ قەستا ناپەرێسم یێن هوون دپەرێسن، و هوون ژی وی خودایی ناپەرێسن یێ ئەز دپەرێسم. دینێ هەوە یێ هوون ڕژدییێ ل سەر دکەن یێ هەوەیە، و دینێ من یێ ژ وی پێڤەتر ئەز ب چویان ڕازی نابم یێ منە..

گاڤا پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) ئەڤ سۆرەتە بۆ وان خواندی، ئەو بێ هیڤی بوون.

## دان و ستاندن:

١- بۆچ سۆرەتا (الکافرون) هاتبوو خوارێ؟

٢- پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) جارا ئێکێ سۆرەتا (الکافرون) ل کیرێ خواند ؟

# ستوونێن باوەرییێ

باوەریئینـان و پشتڕاسـتییە، و د زاراڤـێ شـەرعیدا باوەریئینانـە ب خـودێ، باوەریئینانـە ب ملیاکەتان، باوەریئینانە ب کتێبێن خودێ، باوەریئینانە ب هنـارتی و پێغەمبـەرێن وی، باوەریئینانـە ب ڕۆژا دوومـاهییێ و باوەریئینانـە ب قـەدەرێ چ بـاش چ ژی خـراب، ئـەڤ شـەش تشـتەنە ب چارچۆڤێ دەروونێ مرۆڤی و هزرکرنا ویڤە گرێدایی، چ ئەڤرۆ چ ژی د پاشەڕۆژێدا، د کاروبـارێن ژیـن و ژیارا دنیایێ و خوەشکرنا ڕەوشا وانـدا، دیسا د پاشـەڕۆژا ل بـەر چـێ ببـت د ڤـێ ژیـن و ژیارا دنیاییێدا، یان د وی تشتێ پشتی مرنێ و د دەمێ ڕابوونا پشتی مرنێدا چێ دبت. داکو مرۆڤ ببتـە موسلمان دڤێت باوەری ب هەر شـەش سـتوونێن بـاوەرییێ- ئـەوێن د ئیسـلامێدا هاتینـە ناسـین — بینت، کو ئەم د سۆرەتا (البقره)دا دبینن: ((**آمَنَ الرَّسُولُ بِمَا أُنزِلَ إِلَيْهِ مِن رَّبِّهِ وَالْمُؤْمِنُونَ كُلٌّ آمَنَ بِاللّهِ وَمَلآئِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ لاَ نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّن رُّسُلِهِ وَقَالُواْ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ**)) (**البقرة: ٢٨٥**).

دەمێ پسـیارا ڕامانـا بـاوەرییێ ژ پێغەمبـەری هاتییـە کـرن گـۆت: ((ان تـؤمن باللـه وملائکتـه وکتبه ورسله والیوم الآخر، و تؤمن بالقدر خیـره وشـره — ئـەوە تـو بـاوەرییێ بینـی، ب خـودێ، و ملیاکەتێن وی، و کتێبـێن وی، و هنـارتییێن وی، و ڕۆژا دوومـاهییێ، و قـەدەرێ چ بـاش بـت چ ژی خراب)). (موسلم و بوخاری ڤەگوهازتییە).

## ١- باوەریئینان ب خودایێ مەزن:

باوەریئینانە ب هەبوونا خودایێ مەزن وەک خـودان و خـودا و ئێـک پەرسـتییێ بـێ هـەڤپشـک (شـریک)، و باوەریئینانـە ب وان نـاڤ و پەسـنێن وی ئـەوێن د قورئـانێ و فـەرمۆدەیـێن دورسـتدا هاتین، بێ کو ڕامانا وان بێتە ڤاڕێکرن یـان ب پەسـنێن چێکـرییێن وی بێنـە شـەبهاندن، یـان بێنـە چاواکرن و ئینکارکرن. باوەری ب خودێ ب ڕێکا هزرکرنـێ د هـەبوون و دەروونیـدا پـەیدا دبـت، و ئایەت و نیشـان مـە ڕاسـتەڕێ دکـن و پێـدڤییا باوەریئینـانێ نیشا مـە ددن، مـە ب سـەر بەلگـە و نیشانێن موکوم و ڤەبڕ هلدکن ل سەر ئێکبوونا خودایێ مەزن: ((**سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ**)) (**فصلت ٥٣**)

## ٢- باوەریئینان ب ملیاکەتان:

مەرەم ژ باوەریئینانێ ب ملیاکەتان ئەوە مە باوەرییەکا موکوم هەبت کو خودێ ئەو ژ رۆناهییێ (نوورهێ) چێکرینە و ئەو هەنە، و بێدلییا چو فەرمانێن خودێ ناکن، و وان کارێن خوە ب جە دئینن، ئەوێن خودێ پێ سپارتین. خودایێ مەزن دبێژت: (( لَّيْسَ الْبِرَّ أَن تُوَلُّوا وُجُوهَكُمْ قِبَلَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ وَلَكِنَّ الْبِرَّ مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَالْمَلَائِكَةِ وَالْكِتَابِ وَالنَّبِيِّينَ وَآتَى الْمَالَ عَلَى حُبِّهِ ذَوِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينَ وَابْنَ السَّبِيلِ وَالسَّائِلِينَ وَفِي الرِّقَابِ وَأَقَامَ الصَّلَاةَ وَآتَى الزَّكَاةَ وَالْمُوفُونَ بِعَهْدِهِمْ إِذَا عَاهَدُوا وَالصَّابِرِينَ فِي الْبَأْسَاءِ وَالضَّرَّاءِ وَحِينَ الْبَأْسِ أُولَئِكَ الَّذِينَ صَدَقُوا وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُتَّقُونَ )) (**البقرة ١٧٧**).

## ٣- باوەریئینان ب کتێبێن ئەسمانی:

رامانا ڤێ ئەوە کو ئەم باوەرییێ ب وان کتێبان بینن ئەوێن خودێ بۆ پێغەمبەرێن خوە ئینایینە خوارێ. هندەک ژ ڤان کتێبان ناڤێ وان د قورئانا پیرۆزدا هاتییە و هندەکان ژی ناڤێ وان نەهاتییە ئینان، خودایێ مەزن د سۆرەتا (الأعلى)دا دبێژت: (( إِنَّ هَذَا لَفِي الصُّحُفِ الْأُولَى (١٨) صُحُفِ إِبْرَاهِيمَ وَمُوسَى )) (١٩) و ئەڤە ژی ئەو کتێبن ئەوێن خودایێ مەزن د قورئانا پیرۆزدا ب ناڤکرین: تەورات، ئنجیل، زەبوور، پرتووکێن ئیبراهیم، قورئان.

هندی تەوراتە یا مووسا پێغەمبەرە و هندی ئنجیلە یا عیسا پێغەمبەرە و زەبوور یا داود پێغەمبەرە و پرتووک یێن ئیبراهیم پێغەمبەرن و قورئانا پیرۆز ژی یا پێغەمبەرێ مە موحەمەدە (سلاڤ لێ بن).

## ٤- باوەریئینان ب پێغەمبەر و هنارتییان:

باوەریئینانە ب وان پێغەمبەر و هنارتییێن خودایێ مەزن د قورئانا خوە یا پیرۆزدا ب ناڤکرین، و باوەریئینانە کو خودایێ مەزن ژ بلی وان هندەک پێغەمبەر و هنارتییێن دی ژی هنارتینە، بەس خودایێ مەزن دزانت کا چەندن. خودایێ مەزن د قورئانا پیرۆزدا ب ناڤ بەحسێ (٢٥) پێغەمبەر و هنارتییان کرییە کو ئەڤەنە: ئادەم، نووح، ئدریس، سالح، ئیبراهیم، هوود، لووگ، یوونس، ئیسماعیل، ئیسحاق، یەعقووب، یووسف، ئەییووب، شوعەیب، مووسا، هاروون، ئەلیەسەع، زولکیفل، داود، زەکەریا، سولەیمان، ئلیاس، یەحیا، عیسا، موحەمەد (سلاڤێن خودێ ل هەمییان بن)، دڤێت باوەری ب پەیام و پێغەمبەراتییا ڤان هەمی هنارتی و پێغەمبەران بێتە ئینان. باوەریئینان ب هنارتی و پێغەمبەران ستوونێ چارێیە ژ ستوونێن باوەرییێ، باوەرییا مرۆڤی بێ باوەریئینان ب وان دورست نینە.

## ٥- باوەڕیئینان ب ڕۆژا دووماهییێ:

ڕامان ژێ باوەڕیئینانە ب هەر تشتەکێ خودایێ مەزن و پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) بەحس ژێ کری کا پشتی مرنێ چ دێ چێ ببت، ژ حەق و حسێبا گۆڕێ و نەخوەشی و خوەشییا وی، و ڕابوونا پشتی مرنێ و حەشر و کاغەزێن خێر و شەڕان و حسێب و تەرازوو و حەود و سیرات و مەهدەر (شەفاعەت) و بەهەشت و دۆژەه، و کا خودێ چ بۆ بەهەشتی و دۆژەهییان بەرهەڤکرییە.

## ٦- باوەڕیئینان ب قەدەرێ چ باش بیت چ ژی خراب:

ئەوە مە باوەڕیئینانەکا موکوم و بێگومان ب قەزا و قەدەرێ هەبت، چ باش بت چ ژی خراب.. و مە باوەری هەبت کو خودایێ مەزنە، خودانێ قەزا و قەدەران و ئەوە وان پەیدا دکت.

## دان و ستاندن:

ستوونێن باوەرییێ بهەژمێرە و ل سەر باخڤە.

## بزاڤ و چالاکی:

ڤێ ئایەتا پیرۆز ژ بەر بکە: (( آمَنَ الرَّسُولُ بِمَا أُنزِلَ إِلَيْهِ مِن رَّبِّهِ وَالْمُؤْمِنُونَ كُلٌّ آمَنَ بِاللَّهِ وَمَلَائِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّن رُّسُلِهِ وَقَالُوا سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ )) (البقرة ٢٨٥).



# کارێ ب مفا



رۆژەکێ سەیدایێ پەروەردەیا ئیسلامی، قوتابییێن ڕێزا شەشێ ل سەر چار کۆمان لێکڤەکرن، و داخواز ژ هەر کۆمەکێ کر، کو نموونەیەکێ ل سەر کارێ ب مفا د جڤاکێدا بنڤیسن، پشتی ئەو ل دۆر ڤی ڕەنگێ کاری و ل بەر سیبەرا ڤێ فەرمۆدەیا پیرۆز: ((خیر الناس من نفع الناس)) ئاخڤتین، و پشتی وی ئەڤ پسیارە ل بەر سنگێ وان دانایی:

کارێ ب مفا چییە؟ چاوا مرۆڤ دێ شێت کارێ خوە بکەتە کارەکێ ب مفا؟ ئەرێ مرۆڤ مفایی بگەهینتە جڤاکێ باشترە یان بگەهینتە خوە؟ چاوا کارێ باش مفایی دگەهینتە خودانی؟ نموونەیەکێ ل سەر کارێ باش بینە..

و وی قوتابی ئاگەهدارکرن کو د وانەیا بێت دا هەر کۆمەک دێ نموونەیا خوە بۆ هەڤالێن خوە خوونت.

دەمێ وانەیا دی هاتی، سەیدایی داخواز ژ کاوەیی کر ئەو پێش کۆما خوە ڤە وێ نموونەیێ بخوونت یا وان بەرهەڤکری، کاوەیی بەحسێ مرۆڤەکێ دەولەمەند کر و گۆت: وی ل سەر کیسێ خوە پرەک ئاڤا کر، خەلکی مفا بۆ خوە ژێ دیت، هەڤالێ وان یێ دی مەتین د پێش کۆما خوەڤە

بەحسێ مفایێ چاندنا داران کر، و کانێ چەند ئەو دیمەنێ باژێری جوان دکەن و ژینگەهێ پاقژ دکەن، کەیفا هەمییان ب ڤێ چەندێ هات، و هندەک ژ وان بڕیار دا، کو هەر ئێک ژ وان شتلەکێ ل بەر دەرێ مالا خوە بچینت، و کەیفا سەیدایی ب ڤێ چەندێ هات و ئەو فەرمۆدە دوبارە کر ئەوا ل سەرێ وانەیێ گۆتی، و ب فەرمۆدەیەکا دیڤە گرێدا، یا پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن) تێدا بەحسێ خێرا چاندنا داران دکەت دەمێ دبێژت: (( **ما مِنْ مُسلِمٍ يغرسُ غرساً أو يَزرَعُ زَرعاً، فَيَأْكُلُ منهُ طَيْرٌ أَو انسانٌ أو بَهيْمَةٌ، الاَّ كانَ لَهُ بِهِ صَدَقَةً** )).

و کۆمەکا دی یا قوتابییان بابەتەک ل دۆر قەدرگرتنا مێڤانی و قەنجییا د گەل جیرانی ئامادە کربوو، و ئێک ژ وان ئەو پێشکێش کر، و ب ڤی ڕەنگی هەمییان پشکداری د وانەیێدا کر.

سەیدایی گۆت: گەلی قوتابییان، ئەڤ کارێن هەوە بەحس ژێ کرین، هەمی ژ وان کارانە یێن ب مفا، و هندەک کارێن دی ژی هەنە مفایی دگەهیننە مرۆڤی و جڤاکێ ژی، وەکی پێشکێشکرنا شیرەتان، و بەلاڤکرنا ئیسلامێ و ئاشتییێ، و نیشادانا زانینێ، و هاریکارییا ل سەر قەنجییێ، ومرۆڤانی، و سەرەدانا نەساخان.. و ل دووماهییێ سەیدایی گۆت: دڤێت هەر ئێک ژ مە ڕۆژانە کارێن باش بکەت، دا خودێ و مرۆڤ ژی حەز ژێ بکەن.



## ڕاهێنان:

١- سێ کارێن ب مفا بهەژمێرە.

٢- ئەو کارێ ب مفا چ بوو، ئەوێ کاوەیی د پێش کۆما خوەڤە بەحس ژێ کری؟

٣- سەیدایی دووماهییێ چ گۆتە قوتابییان؟

## بزاڤ و چالاکی:

ڤێ فەرمۆدەیێ ژ بەر بکە: (( **مَا مِنْ مُسلِمٍ يغرسُ غرساً أو يَـزرَعُ زَرعاً، فَيَأْكُلُ مِنـهُ طَيْـرٌ أَو انسانٌ أو بَهيْمَةٌ، الاَّ كانَ لَهُ بِهِ صَدَقَةٌ** )).



وانەیا شازدەیێ

# سەرەدانا نەساخان



قوتابی ڕوونشتی بوون، ل هیڤییا هاتنا سەیدایی بوون، دا وانەیا پەروەردەیا ئیسلامی بۆ وان بێژت، پشتی دەمەکی سەیدایا وان (دیمەن) ب ژۆر کەڤت، و پشتی سوپاسییا وان کری، ل سەر پاڤژیا پۆلێ، بەرێ خوە دایێ، دیت جهێ (بەهزاد) یێ ڤالایە، لەو پسیارا هەڤالێ وی کر:

- کانێ بەهزاد، و بۆچ نەهاتییە؟

هەڤالێ وی گۆت:

- سەیدا د ڕوودانەکا هاتن و چوونێدا بەری دو ڕۆژان دەستێ وی شکەستییە و نوکە ئەو د خەستەخانەیێڤەیە.

سەیدایێ گۆت: ئێک ژ هەوە سەرا وی داییە؟

دو هەڤالان گۆت: بەلێ، دوهی ئێڤاری ئەم ب ناڤێ هەمی قوتابییان چووین و مە سەرا وی دا و مە سلاڤێن هەڤالان گەهاندنێ، و هیڤییا سلامەتییێ بۆ کر.

- هەوە خەلاتەک بۆ وی د گەل خوە بربوو؟

- بەلێ مە دەستکەکێ گولان بۆ بربوو..
- و هوون چەند مانە ل نک؟
- دەمەکێ کورت.

سەیدایا وان دیمەنێ گۆت: دەستێن هەوە خوەش، سەرەدانا نەساخان ئەرکەکێ دینی و ئەخلاقییە، و ئەو ژ مافێن موسلمانینە ل سەر موسلمانی، چونکی ئەو ڤیانێ د ناڤبەرا مە دا بەلاڤ دکەت، و ئەم هەمی دڤێت وەکی ئێک لەشی بین، هاریکارییا ئێکدو بکەین، و خودێ و پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) فەرمان ب وێ چەندێ ل مە کرییە، پاشی وێ هندەک فەرمۆدە و سەرهاتی ل دۆر هاریکاری و سەرەدانا نەساخان ژ ژیانا پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) بۆ وان ڤەگوهازتن، شاهدی بۆ هندێ ددان کو ئیسلام دینێ ڤیان و دلۆڤانییێیە.



## مفا:

هەر تشتەکی تۆرەیێن خوە هەنە، و سەرەدانا نەساخان ژی هندەک تۆرە هەنە، ژ وان ئەوە:

١- دەمێ سەرەدانێ گونجایی بت.

٢- مرۆڤ دەمەکێ درێژ ل نک نەساخی ڕوونەنت.

٣- مرۆڤ دەنگێ خوە ل نک نەساخی بلند نەکەت.

٤- قەرەبالغێ نەکەت.

٥- دوعایا سلامەتییێ بۆ نەساخی بکەت، ل دەڤ وی، و ل پشت وی ژی.

## ڕاهێنان:

أ- ڤان ڤالاهییان ب پەیڤێن گونجایی تەژی بکە:

(سەرا بدەت، سلاڤ بکەتێ، ل دویڤ داخوازا وی بچت)

١- مافێن موسلمانی ل سەر موسلمانی گەلەکن، ژ وان:

ئەگەر نەساخ بوو ...................

ئەگەر داخواز کر .................

ئەگەر د بەرڕا چوو .............

ب- چار تۆرەیێن سەرەدانا نەساخان بنڤیسە:

١-

٢-

٣-

٤-

# ناڤەرۆک